١ - **عمير بن حبيب** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئیمان زیاد و کەم ئەکات، پێیان وت : زیادکردن و کەمکردنی چۆنە؟ فەرمووی : کاتێک یادی الله ئەکەینەوە الحمدلله و سبحان الله ئەکەین، ئەوە زیادبوونەکەیەتی، وە کاتێک یادی نەکەین و لەبیرمان بچێت ئەوە کەمبوونەوەکەیەتی) .

٢ - **أبو هريرة** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئیمان زیاد و کەم ئەکات) .

٣ - **أبو الدرداء** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ئیمان زیاد و کەم ئەکات) .

٤ - **عبدالرزاق الصنعاني** ئەڵێت : (گوێم لە مالک و الأوزاعي و إبن جريج و الثوري و معمر بوو ئەیانوت : ئیمان وتە و کردارە، زیاد و کەم ئەکات) .

٥ - **إسحاق الفروي** وتی : (لەلای مالک بووم وتی : ئیمان کەم و زیاد ئەکات، الله عز وجل ئەفەرمووێت : ﴿ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ﴾: بۆ ئەوەی ئیمانیان لەگەڵ ئیمانەکەی خۆیاندا زیاد بکات ﴾ (**الفتح** : ٤) .

وە ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي : کاتێک ئیبراهیم بە پەروەردگاری وت پێم پیشان بدە چۆن مردوو زیندوو ئەکەیتەوە، الله تعالى پێی فەرموو ئایا باوەڕت پێی نەهێناوە؟ وتی بەڵێ باوەڕم پێیەتی بەڵام ئەمەوێت دڵم ئاسوودە بێت ﴾ (**البقرة** : ٢٦٠) .

مالک وتی : (ئاسوودەبوونی دڵی زیادبوونی ئیمانیەتی) .

٦ - **سفيان بن عيينة** ئەڵێت : (ماوەی حەفتا ساڵە گەیشتووم بە شێخەکانمان لەوانە عمرو بن دينار ئەیانوت : قورئان کەلامی الله یە مخلوق نییە) .

٧ - **قتيبة بن سعيد** دەربارەی عەقیدەی ئەهلی سوننە ئەڵێت : (وە هیچ کەسێک لەسەر ئەنجامدانی تاوان بە کافر نازانین ئەگەر تاوانی گەورەش ئەنجام بدات تەنها نوێژنەکەر نەبێت)، وە ئەڵێت : (شوێنکەوتنی هەموو ئەو فەرموودەیانەی لە رسول الله ـەوە ﷺ هاتووە، مەگەر بزانرێت دانەیەکیان نەسخ بووەتەوە جا کار بەوە ئەکرێت کە نەسخی کردووەتەوە)، وە ئەڵێت : (ئەگەر کەسێکت بینی ئەمانەی خۆشئەویت : سفيان الثوري، مالک بن أنس، أيوب السختياني، عبدالله بن عون، يونس بن عبيد، سليمان التيمي، شريک بن عبدالله، أبا الأحوص، الفضيل بن عياض، سفيان بن عيينة، الليث بن سعد، إبن المبارک، وكيع بن الجراح، يحيى بن سعيد، عبدالرحمن بن المهدي، يحيى بن يحيى، أحمد بن حبنل و إسحاق بن راهويه ئەوە بزانە لەسەر ڕێگاکەیە) وە ئەڵێت : (وە هەر کەسێک وتی ئەوانە - ئیمامەکانی سەرەوە - موشەبیهەن ئەوە بزانە جەهمیە)، وە ئەڵێت : (الله لەسەروو ئاسمانی حەوتەمە لەسەر عەرشەکەی، وەکو چۆن فەرموویەتی : | ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ | (طه : ٥) .

٨ - **يحيى بن معين** ئەڵێت : (قورئان کەلامی الله ـە و مخلوق نییە) .

٩ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (کار و کردەوەکان بە گوێرەی نیەتە، وە ئینسان ئەوە بەدەست ئەهێنێت کە نیازی پێی هەیە، هەر کەسێک هیجرەتەکەی بۆ الله و پێغەمبەرەکەی بێت ئەوە هیجرەتەکەی بۆ الله و پێغەمبەرەکەیەتی، وە هەر کەسێک هیجرەتەکەی بۆ بەدەستهێنانی دنیا یان هاوسەرگیری کردن لەگەڵ ئافرەتێک بێت ئەوە هیجرەتەکەی بۆ ئەو شتەیە کە هیجرەتی لەپێناو کردووە) .

١٠ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (پاکوخاوێنی نیوەی ئیمانە، وە الحمدلله تەرازوو پڕ ئەکات، وە نوێژ نوورە، وە بەخشین بەڵگەیە، وە صبر گرتن ڕووناکیە، وە قورئان بەڵگەیە بۆت یان لەسەرت) .

١١ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (هەموو بەنی ئادەمێک تووشی زینا ئەبێت، دەربازبوونی لێی نییە، زینای چاو نەزەر ە، وە زینای دەست دەستلێدانە، وە نەفس خۆزگە ئەخوازێت و هەوا و ئارەوزووی هەیە و داوێن یش یان بە ڕاستی ئەخاتەوە یان بە درۆی ئەخاتەوە) .

١٢ - **أنس بن مالک** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە بیلال کرد بانگ بە جووت بدات، وە قامەت بە تاک بکات) .

: (بانگ بە جووت بدات) واتە دوو جار بڵێت حيَّ عَلَى الصَّلاة، وە (قامەت بە تاک بکات) واتە یەک جار بڵێت حيَّ عَلَى الصَّلاة، بۆ ڕستەکانی تری ناو بانگ و قامەتیش بە هەمان شێوە .

**١٣ - أنس بن مالك** رضي الله عنه ئەفەرموویت : (رسول الله ﷺ خەوێکی کورت بردیەوە، پاشان بە زەردەخەنەوە سەری بەرز کردەوە، یان پرسیاریان لێ کرد یان خۆی هەواڵی پێدان دەربارەی زەردەخەنەکەی، فەرمووی : تۆزێک پێش ئێستە سوورەتێکم لەسەر دابەزی .

فەرمووی : (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) | إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ (١) فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ (٢) إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ (٣) |

فەرمووی : (ئێوە ئەزانن الكوثر چییە؟) .

وتیان : الله و پێغەمبەرەکەی باشتر ئەزانن .

فەرمووی : (ڕووبارێکە لە بەهەشت پەروەردگارم بەڵێنی داوە پێم، حەوزێکی هەیە ڕۆژی قیامەت ئوممەتەکەم ئەهێنرێنە لای، پەرداخەکانی هێندەی ئەستێرەکانە، بەندە یان پێی ئەدرێت یان لێی دوور ئەخرێتەوە، جا ئەڵێم ئەی پەروەدگارم ئەوە لە ئوممەتەکەی منە!

پێم ئەوترێت : تۆ نازانیت لەدوای خۆی چییان داهێنا ! ) .

**١٤ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (کلیلی نوێژ دەستنوێژە، تەحریم ەکەی تەکبیرەی چوونە ناو نوێژە، وە تەحلیل ەکەی سەلامدانەوەیە) .

---

: (تەحریم) واتە حەرامکردن، بە مانای ئەوە دێت کاتێک تەکبیرەی چوونە ناو نوێژت کرد ئیتر نابێت هیچ شتێکی تر بکەیت کە بەشێک نییە لە نوێژەکە، وە (تەحلیل) واتە حەڵاڵ کردن، بە مانای ئەوە دێت دوای سەلامدانەوەت لە نوێژ ئەتوانیت کار و کردەوەی دەرەوەی نوێژ ئەنجام بدەیت، والله أعلم .

**١٥** - (پیاوێک هاتە مزگەوتەوە بۆ نوێژکردن و رسول الله ش ﷺ تەماشای ئەکرد بەڵام پیاوەکە ئاگای لێ نەبوو، دوو ڕکعات نوێژی کرد، پاشان هات بۆلای رسول الله ﷺ و سەلامی لێ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (بڕۆ نوێژ بکە) .

چوو دوو ڕکعات نوێژی کرد پاشان هاتەوە و سەلامی کرد لە پێغەمبەر ﷺ

.

پێی فەرموو : (وعلیک السلام، بڕۆ نوێژ بکە چونکە تۆ نوێژت نەکرد) .

لە سێیەم جاردا پیاوەکە وتی : ئەی رسول الله ﷺ، فێرم بکە و پێم پیشان بدە، چونکە بەڕاستی هەوڵی زۆرم دا .

فەرمووی : (کە ویستت نوێژ بکەیت دەستنوێژێکی باش بگرە، کە ڕووت کردە قیبلە تەکبیرە بکە، پاشان ئەوەی بۆت ئاسان بوو لە قورئان بیخوێنە، کە ڕکوعت برد تێیدا جێگیر ببە، کە لە ڕکوع سەرت بەرز کردەوە تێیدا جێگیر ببە، کە سوجدەت برد تێیدا جێگیر ببە، پاشان سەرت لە سوجدە بەرز بکەرەوە و تێیدا جێگیر ببە، پاشان سوجدە ببە و تێیدا جێگیر ببە، پاشان هەستەوە، ئەگەر ئەمە بکەیت ئەوە نوێژەکەت بە تەواوی کردووە، وە هەر شتێک لەمە کەم بکەیتەوە ئەوە لە نوێژەکەت کەمت کردووەتەوە) .

١٦ - **عبدالله بن عمر** ئەفەرمووێت : (رسول اللّٰه م ﷺ بینی کاتێک تەکبیرەی چوونەناو نوێژی کرد دەستی بەرز کردەوە هەتا ئاستی شانەکانی، وە کاتێکیش کە ڕکوعی برد، وە کاتێکیش کە لە ڕکوع سەری بەرز کردەوە، بەڵام لە نێوان سوجدەکاندا ئەوەی نەکرد) .

---

: واتە لەکاتی تەکبیرەی چوونە ناو نوێژ و چوونە ڕکوع و سەربەرزکردنەوە لە ڕکوع دەستەکانی هەتا شانەکانی بەرز کردووەتەوە .

**١٧ - محمد بن عمرو بن عطاء القرشي** وتی : (أبا حميد الساعدي م بينی لەگەڵ دە کەس لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، پێی وتن : (ئایا باسی نوێژی رسول الله تان ﷺ بۆ بکەم؟) .

وتیان : (تۆ لە هەمووەمان زووتر هاوەڵی بوویت و زیاتر شوێنی کەوتوویت)

.

وتی : (پێتان پیشان ئەدەم) .

وتیان : (فەرموو) .

وتی : (بینیم لە سەرەتای نوێژدا تەکبیرەی کرد و دەستەکانی بەرز کردەوە، کاتێک ڕکوعی برد دەستەکانی بەرز کردەوە، وە کاتێک سەری بەرز کردەوە لە ڕکوع دەستەکانی بەرز کردەوە، پاشان یەکتۆز وەستا هەتا جومگەکانی لەشی چوونەوە شوێنی خۆیان، پاشان تەکبیرەی کرد و چووە سوجدەوە) .

**١٨ - رسول الله** ﷺ ئەفەرموویت : (ئەگەر سوجدەت برد دەستەکانت دابنێ، وە ئانیشکەکانت بەرز بکەرەوە) .

**١٩ - عائشة** رضي الله عنها ئەفەرموویت : (رسول الله ﷺ دەستی بە نوێژ ئەکرد بە تەکبیرە کردن، وە بە خوێندنەوەی : | ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ | ، وە کاتێک ڕکوعی ئەبرد نە سەری بەرز ئەکردەوە نە نزمی ئەکردەوە - واتە ڕێک

تەماشای زەویەکەی ئەکرد - ، وە کاتێک سەری لە ڕکوع بەرز ئەکردەوە بەپێوە ڕێک ئەوەستا، وە ئەگەر سوجدەی ببردایە و پاشان سەری لە سوجدە بەرز بکردایەتەوە دووبارە سوجدەی نەئەبردەوە هەتا بە ڕێکی دانەنیشتایە، وە نەهی ئەکرد لە عَقِب الشَّیطَان - لە وێنەی یەکەمدا دانراوە - ، وە پێی چەپی ڕائەخست و پێی ڕاستی بەڕێکی ئەوەستاند، وە ڕقی لێبوو کەسێک قۆڵی وەکو دەستی سەگ ڕابخات - وێنەی دووەم - ، کۆتایی بە نوێژ ئەهێنا بە سەلامدانەوە، وە ئەیفەرموو : (لە هەر دوو ڕکعاتێکدا تەحیاتێک هەیە)) .







**٢٠** - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (ڕسول الله ﷺ ڕووی تێکردین و فەرمووی : (هەرکەسێکتان لە نوێژدا - بۆ تەحیات - خوێندن

دانیشت با بڵێت : (التَّحِيَّاتُ للهِ, وَالصَّلَوَاتُ, وَالطَّيِّبَاتُ, السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ, السَّلامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ)، ئەگەر ئەمەی وت ئەوە هەموو کەسێکی باش لە ئاسمان و زەویدا - سەلامەکە - ئەیگرێتەوە، (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) .

**٢١** - **أبو مسعود** رضي الله عنه ئەفەرمووێت : (نوێژی مرۆڤ تەواو نییە ئەگەر سەڵاوات نەدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ) .

**٢٢** - **عائشة** رضي الله عنها دەربارەی رسول الله ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەگەر سەلامی بدایەتەوە لە نوێژ ئەیفەرموو (اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ, وَمِنْكَ السَّلامُ, تَبَارَكْتَ يَا ذَا الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ) .

**٢٣** - **وراد** کاتبی المغيرة بن شعبة ئەڵێت : (معاوية نامەی نووسی بۆ المغيرة پرسیاری لێ کرد : (رسول الله ﷺ چیی ئەوت کاتێک لە نوێژ سەلامی ئەدایەوە؟ وَرَّاد وتی : المغيرة پێمی وت و منیش بۆ معاوية م نووسی، ئەیفەرموو : (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٍ, اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ, وَلا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ, وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ) .

---

: لەدوای تەواوبوونی نوێژ یەکەمجار ئەو دوعایە بخوێنە کە لە ئەثەری **٦٤** هاتووە، پاشان ئەثەری **٦٥**، پاشان ئەثەری **٦٧** .

**٢٤ - رسول الله** ﷺ فەرمووی : (هەر کەسێک لەدوای نوێژ سی و سێ جار بڵێت سبحان الله، سی و سێ جار بڵێت الحمد لله، سی و سێ جار بڵێت الله أكبر، وە لە سەدەم دانەدا بڵێت (لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ, لَهُ الْمُلْكُ, وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوە لە تاوانەکانی ئەبووردرێت ئەگەر وەکو کەفی سەر دەریاش بێت) .

**٢٥ - رسول الله** ﷺ ئەفەرمووێت : (ئەگەر یەکێکتان چووە مزگەوتەوە با سەلام بکات و بڵێت (اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ) وە کە هاتە دەرەوە بڵێت (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)) .

**٢٦ - إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : (پێغەمبەر ﷺ لەنێوان سوجدەکاندا ئەیفەرموو (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي, وَارْحَمْنِي, وَاهْدِنِي, وَاجْبُرْنِي, وَعَافِنِي, وَارْزُقْنِي, وَارْفَعْنِي) .

**٢٧ - إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەرمووێت : (شەوێک لەلای رسول الله ﷺ مامەوە، دوو ڕکعاتی سوننەتی نوێژی بەیانی کرد و دەرچوو بۆ مزگەوت و فەرمووی (اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي لِسَانِي نُورًا, وَفِي سَمْعِي نُورًا, وَفِي بَصَرِي نُورًا, وَمِن فَوْقِي نُورًا, وَمِنْ تَحْتِي نُورًا, وَعَنْ يَمِينِي نُورًا, وَعَنْ شِمَالِي نُورًا, وَمِنْ أَمَامِي نُورًا, وَمِنْ خَلْفِي نُورًا, وَاجْعَلْ فِي نَفْسِي نُورًا, وَأَعْظِمْ لِي نُورًا) .

١ - **إبن عباس** پرسیاری لە رسول الله ﷺ کرد دەربارەی ئایەتی : | وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ | (**البقرة : ٢٥٥**) فەرمووی : کورسیەکەی جێگەی پێ یەتی، وە عەرشیش گەورەییەکەی ناتوانرێت دیاریبکرێت .

٢ - | وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَىٰ آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا : بەدڵنیاییەوە لەپێشدا پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت - کە لەو درەختە نەخوات - کەچی لەبیری چوو، بەڵام لێبڕان و پلانێکمان لێنەدی بۆ شکاندنی فەرمانەکەمان | (**طه : ١١٥**)

قال أبو عبدالله إبن مندة أخبرنا علي بن العباس الغزي قال حدثنا محمد بن حماد قال حدثنا عبدالرزاق قال حدثنا الثوري عن الأعمش عن مسلم بن البطين عن سعيد بن جبير عن إبن عباس رضي الله عنهما قال : (إنما سمي الإنسان إنسانا لإنة عهد إليه فنسي) .

**إبن عباس** رضي الله عنهما ئەفەمووێت : (ئینسان بۆیە ناوی لێ نراوە ئینسان چونکە پەیمانی لێ وەرگیرا بەڵام لەبیری کرد) .

٣ - **رسول الله** ﷺ لە تەفسیری ئایەتی | لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ : بۆ ئەوانەی چاکە ئەکەن پاداشتی زۆر چاک و زیاد لەوەش هەیە | (**یونس : ٢٦**) ئەفەرمووێت : تەماشاکردنی ڕوو (وجه) ی پەروەردگاریان جل وعز .

٤ - ئیمامی **أبو بكر** رضي الله عنه لە تەفسیری ئایەتی | لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ | (**يونس** : ٢٦) ئەفەرموویت : تەماشاکردنی ڕوو (وجه) ی الله جل وعز

٥ - **أبو عبدالله إبن مندة** (**٣٩٥** ه) ئەڵێت : الله عز وجل ئەفەرموویت : | وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ * إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ : ئەو ڕۆژە ڕووخسارگەلێکی جوان تەماشای پەروەردگاریان ئەکەن | (**القِيَامَة** : ٢٢ - ٢٣) .

زانایانی تەفسیر وەکو إبن عباس و هاوەڵانی تر، وە لە تابیعین وەکو محمد بن كعب القرضي و، عبدالرحمن بن سابط و، الحسن بن أبي الحسن و، عكرمة و، أبو صالح و سعيد بن جبير و بێجگە لەوانە ئەڵێن ماناکەی بریتیە لە : (تەماشای ڕووی پەروەردگاری ئەکات) .

٦ - **رسول الله** ﷺ ئەفەرموویت : (هیچ دڵێک نییە ئیللا لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی الرحمن دایە، ئەگەر بیەوێت جێگیری بکات ئەوە جێگیری ئەکات، وە ئەگەر بیەوێت لایبدات ئەوە لایئەدات)، وە فەرمووی : (ئەی هەڵسوڕێنەری دڵەکان دڵم لەسەر دینەکەت جێگیر بکە)، وە فەرمووی : (تەرازوو بە دەستی الرحمن عز وجل ە، بەرزی ئەکاتەوە و دایئەبەزێنێت) .

٧ - أخبرنا عبدالرحمن بن يحيي وعبدالله بن إبراهيم، قالا حدثنا أبو مسعود الرازي، قال أخبرنا عبدالرزاق عن معمر عن الزهري عن عروة عن

عائشة عن **النبي** ﷺ قال : (الله عز وجل فریشتەکانی دروست کرد لە نور، وە جنۆکەکانی دروست کرد لە ئاگر، وە بەنی ئادەمی دروست کردووە لەوەی کە بۆتان باسکراوە) .

---

: الله عز وجل لە وەسفی خۆیدا ئەفەرمووێت : | هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ طِينٍ | **(الأنعام : ٢)**

ئەو - واتە الله عز وجل - ئەوەیە کە لە قوڕ دروستی کردوون .

٨ - **عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه فەرمووی : یەهودیەک هات بۆلای رسول الله ﷺ وتی : الله ئاسمانەکان لەسەر پەنجەیەک ئەگرێت، وە زەویەکان لەسەر پەنجەیەک، وە چیاکان لەسەر پەنجەیەک، وە دارەکان لەسەر پەنجەیەک، وە دروستکراوەکان لەسەر پەنجەیەک .

جا رسول الله ﷺ پێکەنی تا خرێیەکانی ددانی دەرکەوت، پاشان فەرمووی : | وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ | **(الأنعام : ٩١)** .

لە ڕیوایەتی فضیل بن عیاض عبدالله بن مسعود فەرمووی : رسول الله ﷺ پێکەنی بەهۆی بەڕاستدانان و سەرسام بوون پێی - واتە بە جولەکەکە - .

